بتی سەردەم

مـــــــــەزانن هەر پەیکەرەی تــــــــــاشرایە بت

هــــــی ئەمڕۆکە و سەردەمی کۆن جیایە بت

بتـــــــــــی ئەوکات درووستکراوی مادده بوو

لەم ڕۆژگـــــــــــارە فیکـــــــــــر و ئایدیبیایە بت

زەمانی خۆی ڕووت و قووت بوو ئێستاکەش

سەرۆکێــــــکە قــــــــــــــــــاتی لەبـەردایە بت

بتـــــــــــــی پێشتر سەروو ماڵی ژووریَ بــوو

ئـــــــــــــەلعان خـــاکی قــەومیی بە ئاڵایە بت

لـــــــــــە کۆن حیزبە و بتێکی خــۆی دەپەرست

نـــــــــــەهــــــــا حیزبی تێکدەر و گــومڕایە بت

ئـەوسا بتپەرستیی یـــــــــــــاسای خـۆی هەبوو

ئێستاکـــــــــــــــــە هەر خودی خۆی یــاسایە بت

بتـــــپەرستن هــەر چـــــــــــوونە مەعبەد نییە

هـــەر فـــــــــــەرمانداریَ بە غەیری خـوایە بت

مەدخەلی ناساڵح

مـــــەدخەلیش هەر سەلەفییە

تــــــــــــــەنیا شمشێری دزراوە

سیفاتی وەک سەحــــــــــابەیە

بــــــــــــەس غیرەتی پێنەماوە

کــــــــــۆتری ئاشتی ڕاگرتووە

کــــــــــــــــۆتربازێکی تەواوە

بۆیە نـــە کەس کوشتوویەتی

نـــە کەس بەدەستی کوژراوە

ئــــــــــیمانی زۆر بەخوا هەیە

بەس کافرە بە حوکمی خواوە

تـــــــــــــــــاغووتی لەلا کافرە

ئیـــــــــــــمانیشی پێی هێناوە

لــــــــــــــەگەڵ کافر دژی یەکن

بـــــــــەڵام برایەتیان چەسپاوە

مـــــــــوجاهیدانی خۆشدەوێ

بــــــــەس ڕقی لێیان هەستاوە

نـــــــــــــــــــامۆترین غوڕەبایە

ئـــــەگەرچی زۆر خۆش ژیاوە

حـــــــــــــــــەیف تۆزێک ژنانییە

دەنـــــــــا گەلێک مەرد و پیاوە

شاعیرێکم

شاعیرێکم

وەک قەل بە گوێی ڕووڕەشاندا دەقیڕێنم

ئارامییان دەشێوێنم

گەر بمەوێ

بەس بە تینی گەرم و گوڕیم

زاڵم ئاو بێ دەیسووتێنم

لە ئارەقەی ماندوێتیم

گەر ستەمکار ئاگریش بێ

دەیتەزێنم

گەر تووڕەبم غیرەتیش بێتە بەردەمم دەیترسێنم

لە دەستمدێ ببمە کابووس

نووستن لەخەو هەڵبستێنم

بە هاوارێک بێدەنگیی بە قسە دێنم

بە یەک هەستان

جەللادەکان دەکەوێنم

بۆم بڕەخسێ

بە نینۆکم کێوی ستەم لە بن دێنم

شەڕکەرێکم باڵام لە سەنگەری دوژمن دەچەقێنم

بە بەژنی خۆم

داری ئاڵاکەم دەڕوێنم

ئاویشی دەدەم بە خوێنم

بە کفنیشم

پەرچەمی بەیداغی یەکبوون دەشەکێنم

بە یەک مەرگ هەزار مردن دەژیێنم

زەندەقی نەمان دەچوێنم

ئینجا بۆخۆم

پلەی شەهیدی و نەمریی

لەناو فیردەوسی بەرین دا بەدەست دێنم

تەکفیر!

هەرکەس نەیەوێ حوکمی خوا کافـرە

بــڕواداربێ یا بێ بڕوا کـــــافــــرە

حەزدەکەی با کوڕی پێغەمبەریـــــش بــێ

بەس قوڕئان نەکا بە یـــاسا کـــافــرە

کافر هەر کافرە مـسوڵمان یا جــــوو

ئەوەی کــــوفر بکا ئــــیللا کـــافرە

هەر مرۆڤێک بە غەیری دەستووری خـوا

دەنـــگ بە دەستووری تر بدا کافــــرە

کافربوون کوفرە نەوەک کافــرکـــردن

ئـــــەوەی کافر کافر نــــەکا کـــافـرە

بەس ئیسلامە

کۆتا پەیام لەلای خواوە

کە بۆ زەوی نێردراوە

بەس ئیسلامە

تاکە ئاینی ئەو دەورە

ئێستا دینی خودای گەورە

بەس ئیسلامە

دەتەوێ بژیێی بێ درۆ

ئەگەر ڕاستیت دەوێ ئەتۆ

بەس ئیسلامە

تاقە ڕێی لە کوفر جودا

پردی گەیشتن بە خودا

بەس ئیسلامە

ئەوەی ئەلعان دەستی حەقە

بۆ ڕوومەتی باتڵ شەقە

بەس ئیسلامە

قەیناکە ئەگەر حەیوانی

بەڵام دەستووری ئینسانی

بەس ئیسلامە

شكۆی موجاهید

چــیا كاتێ بــاڵای موجــاهیـــــــدی دی

گوتی كوانێ من سەركەش نیمە چـیدی

كە تێــــــــــــڕاما لــە سام و لە هەیبەتی

هەوری بەخــــــۆی دادا لەبەر حورمەتی

ئەو دەمەی مــانگ لە ڕووخساری ڕوانی

پەشیمان بوو بەخۆی گـوت كەی جوانی

شــــــنە باسی بێگەردی بــــــۆ بردەوە

كـــــــانی سازگار بێزی لەخـۆی كردەوە

ئاگر لۆمەی خۆی كرد بـــە سارد و سڕی

كە هەستی كرد بە تـــــینی گەرم و گڕی

ڕایكردە كێو ئـــاسۆی گـــەشی سپێدە

تكای خوایكرد نیوەی هیوای ویـم پێدە

خۆر كــــــــە زانی ئەوەندە خـۆنەویستە

وتی خۆزگم بەخۆی چەند خۆشەویستە

هەڵۆ بینی گــوتی كوێراییم دایـــــــــــە

من هەر زەوی ئەو بە ئاسمان بـــــــینایە

کاتژمێر گەرچی لەلێدان نـــــــــەوەستێ

دواده کـــــــــەوێ خـۆی لەقۆڵی نەبەستێ

ئـــــــــیمانی دەهێـــــــنا کـــــــــــوفر ژییابا

تا دڵی مـــــــــــــــــوجاهید ئـــەوی تییابا

ئاگادارکردنەوە

دڵنیا بن

ئەی ڕەشبینان

خۆری خودا هەرگیز بە فووتان کز نابێ

هەڵدێتەوە تاریکایی دەسووتێنێ

شەو تا ئەبەد ئارامگەی ئێوەی دز نابێ

دوژمنانی بەهاری دین

ئاگاداربن

تا بارانی خوێنی شەهیدان بباریێ

وەرزی ساڵ هەر پاییز نابێ

ملشۆڕەکان چاک بزانن

خودا شێری کردۆتە شێر

قەت بە ڕێوییان حیز نابێ

هۆ بەدبینان

چاک سەیرکەن

چۆن لووتکەی شاخ نەوی نابێ

ئاواش هەڵۆی خوداویستیی

لە دۆڵی نزم و دوور لە خوا کەوی نابێ

هەر بۆیەشە

نوورێک خودا لە ناو دڵێک پێیکردبێ

زیندانی تار نایکوژێنێ

پشتێک خودا پشتگیری بێ

قامچی بەشەر بۆ غەیری خوا نایچەمێنێ

قاچێک ڕێی ڕاستی گرتبێ

زنجیری خوار نایشێوێنێ

دەستێک پەنجە شەهادەکەی بجوڵێنێ

سەد کەلەپچەش نایوەستێنێ

ئەقڵێک دەبڵی کوفری نەبێ

هەزار تەعزیبی کارەباش

تەزوو بۆ مێشکی ناهێنێ

سەرێک بەس بۆ خودا شۆڕبێ

بەس سەربڕین دەینەوێنێ

هەڕەشە

ئاسمان کڵاوت بێ

زەویش پێڵاوت بێ

گەر پشتت چیا بێ

سینگیشت قەڵا بێ

بەژنت قەدی داربێ

مانگیش بۆت ڕوخساربێ

بفڕی وەک تەیارە

لێت بەڵا بێ پارە

گڕکان قووەتت بێ

زریان غیرەتت بێ

عومری نووحت هەبێ

هەزار ڕووحت هەبێ

بشنەڕی وەک شێری

بە مردن ناوێری

دینی گێلان!!

لە دیموکراسیی دا قوربان

گەر شەش نەزان

دەنگبدەن بە حوکمی دزان

زانایەکیش بڵێ بەڵێ

بۆ حاکمێکی بە ویژدان

یاسا وایە بەزۆرینەی دەنگی خەڵک

بە فەرماندار دەدرێ فەرمان

ئگەر ئەو خەڵکە مرۆڤ بن

یانیش حەیوان

جا حەڵاڵ بێ یانیش حەرام

بەپێی دەنگدان

حوکمی دزان دەکرێ ئیعلان

لە پەڕلەمان

ئەمەیە ئێوە پێی دەڵێن دیموکراسیی

منیش دەڵێم "دینی گێلان"

دڵنیایی

هۆ کافران

دڵنیا بن ببنە شاخیش ئێمە هەورین

ببنە داری هەزارساڵەش

ئێمە تەورین

لێناگەڕێین هەبن هەرگیز

گەر گەڵا بن

بۆ ئێوە دەبینە پاییز

هەتا ماوین

گڕ بن ئاوین

خەو بن چاوین

سەر بن ژانین

قاچ بن شکانین

مل بن شیرین

دڵ بن تیرین

زمانبن چەقۆین

مار بن هەڵۆین

خوێن بن ژەهرین

ترس بن دێوی بە قەهرین

تا سەرنەکەوین ناسرەوین

شەو بن خۆرین

خۆر بن شەوین

مەڕ بن گورگین

گورگ بن مەرگین

ئێمە ئاواین

ساغبن دەردین

دەرد بن دەواین

بەڵێ بەڵێ پاڵەوانین

ئەگەر ئازاد بن زیندانین

زیندان بن ئازادیی ژیانین

پێشنیاری پاشکەوتوو

دیموکراسی لە ئینتیخاب پێمدەڵێ

لەناو شەش دز بۆ کامەی دەڵێی بەڵێ

منیش دەڵێم دزم ناوێ ئەزیزم

بە حەقفرۆشێ بفرۆشە گێچەڵێ

خودا دەڵێ چارەی دز دەستبڕینە

نەک بە دەستت بۆ دزی پێیدەی هەڵێ

ئێ باشە خۆ بچم نەچم هەر یەکە

ماڵ کە دزرا جا لە هەر کام باخەڵێ

جا گەر ئەمن گوێڕایەڵی خوا نەبووم

فەرقم چییە لەگەڵ بەچکە ئاژەڵێ

ئا ئەوەیە بەینی ڕێبازی خودا

لەگەڵ بەرنامەی کارنامە پووچەڵێ

ئەگەر قورئان لەجێی دیموکراسی با

لە سەرزەوی نەدەما هیچ گەندەڵێ

قەترەی پیرۆز

بـــــــــــــــــارانی هەموو ئاسمانێ

فـــــــــــــــرمێسکی هەرچی گریانێ

چی پشکە ئـــــــــــــــــارەقی ڕژاو

بۆنی شووشەی گشت زەمـــــــــانێ

تنۆکی کـــــــــــــــــانیاوی دونیا

قەترە قـــــــــــــــەترەی خڕ دەرمانێ

شەونمی سەر هـــــــــــەر گوڵ هەیە

تک تک نەوتی هـــــــــــــەر مەکانێ

هەرچی شلەی سەر ڕووی گەردوون

خەڵک پێیزانێ و نـــــــــــــــەیزانێ

ناگـــــــــــــەن بە یەک زەڕڕە خوێنی

ڕژێـــــــــــــــــــنراوی مسوڵمانێ

قسەم هەیە

گوێم لێگرن قسەم هەیە

وەک دەزانن

گەلێ جاران

سەر بۆ شانی ئازیزانە

جارووباریش بۆ کەللەیە

دەست بڕێک جار بۆ تەوقەیە

بۆ تەوقات و بۆ زللەیە

قاچ هەندێ کات بۆ شاییە

هەندێ کاتیش بۆ لەققەیە

دینی ئیسلامیش ئاوایە

وەکو ئاوە

لە یەک باردا جێگیر نییە

دوو شێوەیە

لەگەڵیدا گەرم و گوڕ بی

نەرم و شلە بێ کێشەیە

ئەما سارد و سڕ بی لە ڕووی

ڕەق و توندە وەک شەختەیە

جەژنی مسوڵمان

تەنیا ڕەمەزان و قـــــــــوربان

جەژنن بۆ کەسی مسوڵمـــــان

خۆتان یەکلابکـــــــــــــەنەوە

دوو دین نابن بۆ یەک ئینسان

یان لەسەر دینی ئیسلام بـــن

یانیش دینی قەومی کوردان

واز لە مونافیـــــــــــــقی بێنن

چیتر بەخۆ مەکەن بوختـــان

ئاگر و ئیسلام دژیەکـــــــــن

ئیسلام نوورە ئـــاگر شەیتان

ئیسلام فێنکایی بـــــەهەشتە

ئاگر دۆزەخە بـــــــۆ سووتان

نەورۆز جەژنی ئـــاگرپەرست

لێتان پیرۆز ئەی گـــــومڕایان

بە سووتانی دۆزەخـــــتان بێ

ئەو گڕانەی داتانگـــــــــیرسان

بەدیلی پووچ

مسوڵمان غـــــــیرەتی نــــــــــەماوە ئێستا

بـــــــــــــــــۆیە کافر دونیای بە ناوە ئێستا

لــــــــــــــە باتی عیززەتی ئوممەتی ئیسلام

قــــــــــــــەومییەتی زەلیل چەسپاوە ئێستا

گـــــــــرینگ نییە کوفرە حوکمی غەیری خوا

ئــــــــــــەوەی گرینگە مووچە نەبڕاوە ئێستا

لەجێی دینداریی و کۆششی ڕێی بەهەشت

کــــــــــــــەسابەتی دونیای هیچ باوە ئێستا!

مــــــــــــــــــــوجاهیدی حۆرییان تیرۆرستە

بــــــــــــــــەناو نێری ژنپەرست پیاوە ئێستا

لــــــــــە شوێن خیلافەتی هەموو سەرزەوی

خــــــــــــــــانوێکی سەت مەتر شیاوە ئێستا

داد و بێداد لــــــە دەست ئینسانی سەرشۆڕ

دەک نەمێنێ هەر لــــــــــــــە ئێستاوە ئێستا

خوێنی مسوڵمان

خـــــــــوێنی مسوڵمانان قەرزە

ئامــــــان بۆ کەسێک دەیسێنێ

خـوێنی خۆی و قەوم و قیلەی

لـــــــــــە ڕەهەندی دەدۆڕێنێ

خــــــــــوێنی مسوڵمان بارانە

هـــــــــاوار بـــۆ وەی دەیبارێنێ

لافـــــــــــــاوی تـــیژی نەبڕاوە

بـــۆ بـــەردەم خۆی دەخولْقێنێ

خــــــــــوێــنی مسوڵمان تیزابە

ئـــــــای لەوەی دەستی بۆ دێنێ

دەرگای دۆزەخ بەڕووی خۆیدا

دەکــــــــــــاتەوە دەیسووتێنێ

خـــــــــوێنی مسوڵمانان ژەهـرە

وای بۆ ئـــەوەی دەیـــــــــرژێنێ

خوا دەمـی بە عـــــــەرزا دەدا

دەیــخواتەوە دەیتۆپێـــــــــــنێ

هەر قورئان

ئەگەر بـــــمخنە نـــاو زیندان

لەویٚ قورئان لەبەر دەکــەم

ئەگەر بە ئـــازادی بـــــــــژیم

حاکمی قورئان سەردەخەم

ئەگەر شەهیدیشیان کـردم

ناو گۆڕ شایـەدی پێـدەدەم

لەناو ڕۆژی قیـــــــــامەتیشا

پەنجەی ئیمانی بۆ دەبـــەم

لە فیردەوسی بەرینیش بم

هەر قورئانە کیـــــــــتابەکەم

# خەیاڵی تۆڵە

ئـــــــــەگەر ئاسمانیش لەسەرتان لاچێ

لەتـــــــــرسی دەستتان نەک بۆ هەوا چێ

زەوی نـــوقم بــــــــێ خۆی سەراوژێر کا

لەخەوفی قاچتان نـــــــــەوەک تێبڕاچێ

شاخیش بـــــــــــــلەرزێ سەری نەوی کا

نــــــــــــــــەوەکو سەرتان بەلای ئەواچێ

زەریاش لـــــــــــە سامتان خۆی بخواتەوە

نـــــــەک خــوێنمژیتان فیکری بەو داچێ

لە ئاستی ئێـــــــــــــــمە هێشتا زەلیــــــــلن

هەمـــــــــوو قووەتتان نـــــــــاگا بە ماچێ

چیمان لێـــــــــــــدەکەن کەیفی خۆتان بێ

بەس خەیاڵ نەکەن خوێنمان هەر واچێ

ڕۆڵــــــــــەی عــــــــــومەر و خالیدین ئێمە

تاڵێک مووی سەرمان لــــــەسەرتان ناچێ

پەڕڵەمان

پەرستگای لات و عـــــوزایە پەڕڵەمان

مەڵبەندی کوفری دونیایە پـــەڕڵـەمان

جێگـــــــــەی دانانی حەرام و حــــەڵاڵە

عەڕشی چەندەها خودایە پـــەڕڵەمان

مـــــاددەکانی دەستوورەکەی ئـــــایەتن

ئیشی بــــــە قوڕئان نەمایە پـــــەڕڵەمان

حـــــــــەقی نییە کێ حەقە کــــێ باتڵە

زۆرینەی لـــــــــەلا ڕەوایە پـــــەڕڵەمان!

دەڵێ حوکم دەبێ حوکمی بەشەر بێ

واتـــــــــە بەشەری لا خوایە پەڕڵەمان!

مــــــەگەر خوا ناڵێ حوکم هەر بـۆ منە

لە ئـــــــــــەمری خوا بەڕەڵڵایە پەڕڵەمان

ئەوەی دەنگی پێدا بـــــــەردە وەکو ئەو

کـــــــــــــــــەڕ و لاڵ و نابینایە پەڕڵەمان

باغۆز

بـــــــاغۆز هەڵەبجەی دینەکەم

هیرۆشیمـــــــــــــای ئایینەکەم

ئـــــــــەی گۆڕستانی شەهیدان

هـــــــــــۆ شارە بێ تەڵقینەکەم

تـــــــــــــابووتی بێناوی غەریب

تـــــــــــــەرمە بێناز و شینەکەم

تـــــــۆز و خۆڵت بوونەتە خوێ

بــــــــــــۆ سەر کۆنە برینەکەم

وەک مووشەکـــــــــی ئاگرینت

بــــــــۆت بە ئەشکم گرینەکەم

حەیفە لە دوای شەهید بوونت

هێشتا زیندووم و ژینـــــــەکەم

نـــــــــــــەیاران و دوژمــــــنانت

هەزارجـــــــــار بە نەفرینەکەم

جەژنی من

جـــــەژنی من ئەو ڕۆژەیە گەر
حـــــــــوکمی خودایی بێتەوە
جـــــا سەری ساڵ یا بنی ساڵ
گـــــــــــرینگ کوفر ببڕێتەوە
لـــەلای من شینە ئەو جەژنەی
کـــــــــــافر پێی بگەشێتەوە
ئەو جەنگەیە جـــــــەژنانەکەم
مـــــوشریک پێی نەحەسێتەوە
خـــــــوا دەڵێ عیسا نەمردووە
خـــــــــاچت هێنا لە کوێتەوە؟
گـــــوایە مردووە لە خاچدراوە
یـــــــانی خوا درۆ دەڵێتەوە؟!!!
یادی ساڵی نوێی چی دەکەی؟
بەو ئەقڵە کــــــــۆنەی پێتەوە
سەری ساڵ نــــــــا بنی دۆزەخ
سەدجــــــــار پیرۆز بێ لێتەوە

سۆراغی غیرەت

هــاوڕێی ئەسحاب و پێغەمبەر تۆ لە کوێی

وێـــــــران کرا وا دەشت و دەر تۆ لە کوێی

هەردوو چاومان دەرهات لـە چاوەڕوانییت

لەهیچ چـــــــــاوێ نایەیتە دەر تۆ لە کوێی

دینی ئیسلام بەخووڕ خـــــــوێنی دەچۆڕێ

نێیتە گـــــــــۆڕێ قوڕمان بەسەر تۆ لەکوێی

قـــــەت وەک ئێستا زەلیل نەبووین و نابین

ئێستا نێی نایەی تـــــا مەحشەر تۆ لە کوێی

ڕاستە خـــــــــــــۆمان لە تۆ ڕامانکردووە

مەکە بە خـــــــــــراپەی نابەشەر تۆ لە کوێی

گـــــــــــــــومان دەکەم مردبیت و نەمابی

لـــــــــــــەمێژە ماوی بێ ئەسەر تۆ لە کوێی

بـــــــــــــــــــــگەڕێوە گـەردنت ئازاد نەبێ

ئەی غیرەتی کـــــەلـلەی عـومەر تۆ لە کوێی

ئێمە گەنمین

بشمانخەنە ژێر خاکەوە

جارێکی تر دەڕوێینەوە

بشمانهاڕن بەدار و بەرد

دەبین بە ئارد ناشکێینەوە

بشمانشێلن بە گشت هێزتان

دەبین بە هەویری شل و ناتوێینەوە

دونیامان لێبکەن بە تەنوور

دەبین بە نانێکی گەرم و

لەگشت ماڵێ دەژیێینەوە

هەناسەی مەرگ

تەنیـــــــــــــــــایی ئاوەدان ترە

لەوەی بێوەفـــــــایەک لات بێ

نامــــــــــــــەردی مەردانەتـــرە

لەوەی نامـــــــەردێ پەنات بێ

دزی سەربـــــەرزانەتـــــــــــرە

نەک دزێ فەرمـــــــانڕەوات بێ

ئـــاوارەیــــــی وەتەنتـــــــــــرە

لــــە فرۆشراوێ بۆت وڵات بێ

کەرێتـــــــــی ئاقڵانـــــــــــەترە

لە کـــــەر پێشڕەوی ڕێگات بێ

بتێ بیت ئیمـــــــــــــــاندارتری

لـــەوەی بەشەرێک خودات بێ

تاریکـــــــــە شەو ڕوونـــــاکترە

لەوەی جاهیلیی چرات بـــــێ

زینـــــــــــدان ئازاد ترە لەوەی

بەڕەڵڵایی دوای دەرگــــات بێ

مردن هـــــــــــەناسەی زیاترە

لە کۆیلەیی سەد حـــــەیات بێ

ژنە مولحید

بـــــــــۆیە شەرم و حەیا ونە

تۆش وەک مەریەم ناوت ژنە

ژنـــــــــی ژنـــــــانە ژیـــــــانە

ژنـــــــــی وەک تۆ ژان مردنە

ژنـی مەرد نامووس دەهێنێ

کـــــــــاری تۆ نامووس بردنە

لـــــــەجێی منداڵ پاراستنت

ئیشت بـــــــــــــەڕەڵڵاکردنە

دەبێ ناوماڵت چەن پیس بێ

مێشک و دڵت وا چڵـــــــــکنە

ڕاکــە چێشتەکەت نەسووتێ

زارت وەک کیسەی تـــــووتنە

تـــــۆ ژن نی بەڵکو ئەو پیاوە

ژنە کـــەوا تـــــــۆی لە کنە

باش بزانن

باش بزانن ڕێبەر بەتەنیا پێ نـــــــــــییە

ئاگاداربن هەموو ڕێگایەک ڕێ نییـــــــــــە

ڕێیەک گردە ڕێیەک دۆڵە ڕێیەک داخراو

ڕێی هیدایەت بە بەربەست و گرێ نییە

مەڕۆنە ڕوای قاچاخچییانی دونیا ویست

گشت پێشڕەوێک پەساپۆرتێکی پێ نییە

زۆر وریا بن نەکەونە ناو تاریکـــــــــستان

لە ڕێگایەک نووری قورئان لێی پـێ نییە

پردی سیرات تاقانەیە نەک هـــــــەزاران!

هەموو کۆتا ڕێیەک بەهەشتی لـــێ نییە

گۆڕی مامۆستا کامەران

بـــــــــە مردووییش لە زۆر زانا پیاوتری

لەناو قەبریش لەوان زیندوو و مــاوتری

ئــــــــــەگەرچی وا لەناو گۆڕ ڕاکشاوی

لــــــــــــە مەیدانا قیت و ڕاوەستاوتری

لـــــــــــــەو مەلایانەی پێڵاوی تاغووتن

بــــــــــەوەستاویش لێیان بەهەنگاوتری

خـــــــــودا ئاسمان بڕوخێنێ بەسەریان

بـــــــە ڕووخاویش لە وان دامەزراوتری

چــاوەکەم گەرچی لێکتنان چاوی شین

لـــــــــــەچاو ئەوان بەچا و بەرچاوتری

نیقاب

نیقاب هەوری چواردەورەی مانگ
ئـــــــەی میکیاجی خـــــواپێداوان
پــــــەردەی سەر پەیکەرەی حۆری
ئـــــــــــــــاڵای بەرزی نەدۆڕاوان
بـــــــــاڵی هـەڵۆی لووتکەی شاخی
سەری مــــــــــــــوەحیدەی بێتاوان
قـــــــــــــەڵای دەوری تاجی شاژن
هـــــــۆ قەڵغانی تـــــیـــــری چاوان
جـــــــــــــــامی ڕەشی کوفر تۆقێن
تــــــاڤگەی سەربەرز و نەخشاوان
پـــــــــــــــەڕاوی شەهادەی ئەخڵاق
پـــــــــــــــەڕەی شاگوڵ و گوڵاوان
تـــــــووکی پێستی ڕووی شێرەژن
کفـــــــــــــــنی ئـــــارەزووی ناپیاوان
ئـــــــــەی لافیتەی مەرگی خەونی
ئـــــــــــــــەو بێدینانەی بیرساوان

شۆڕشی خوێن

قەترە خوێنی مسوڵمانێ

کە دەڕژێتە سەر بەرماڵێ

بەرز دەبێ لەگەڵ دوعا

بەرەکەت دێ لە گشت پاڵێ

لەگەڵ ئارەقی شەهیدان

دەیخنکێنن گشت ساماڵێ

بەخوڕ دادەکەنە زەوی

وەک بارانی هەزارساڵێ

دار و بەرد دەبێتە لافاو

عەرشی کوفر ڕادەماڵێ

ئەوسا کافری ترسنۆک

نایمێنێ هیچ کون و چاڵێ

سەرکەوتن هەر بۆ ئیسلامە

لەهەر جێگە و بەهەر حاڵێ

شاڕێگەی خودا

گەر ئیسلام هەر هی عەرەب بێ

بە فلسێکی سووتام ناوێ

چونکە هەرچی چاڵی عەرەب

هەبوون کەوتوومەتە ناوی

ئەگەر ئیسلام هەر میراتە

بەجێماوە لە باوانم

سندان لە بەشم نامەوێ

حاشا ئەمن هیچی وانم

گەر ئیسلامبوون هەر سیاسەتە

کافریم پێی شانازییە

سیاسەت درۆ و دەلەسەیە

کۆیلایەتیی و فێڵبازییە

دڵنیا بن گەورە و بچووک

با کەس گومانی وا نەبا

شێت بام مسوڵمان نەدەبووم

ئیسلام شارێگەی خوا نەبا

سەرۆکم موحەممەدە

مـــەگەر ناوکم چۆتە چۆکم

تـــــــــا بەتۆ بڵێم سەرۆکم

حەوت نەوەشم وات پێبڵێن

وای دادەنێم کـــــە نەزۆکم

سەدی وەک تـۆ حیمایەم بێ

بێغیرەتم تـــــــــــــــرسنۆکم

سەرۆکێک دوژمنی خـوا بێ

لەگـــەڵ مردووشی ناکۆکم

بــــــە کۆیلەش وەری ناگرم

غەدرە بیخوا نیسک و نۆکم

سەرکردەی من موحەممەدە

تــــا ئەلحەد دەگرێ بەرۆکم

ئەوی وەک ئـــەو حوکم نەکا

نایکەم بە خاولی و پەڕۆکم

ئاوێنەی دووڕووان

ئەگەر ئیسلام دوور لە دین با

گەمە و گاڵتە و پێکەنین با

گەلێک زووتر دەیانسەپاند

دەستوور و بەرنامەی ژین با

گەر ئیسلام کۆشک و دۆلار با

دوژمنی چاوی هەژار با

دەمانبینی لە گشت جیهان

فەرمانڕەوا و حاکمدار با

گەر ئیسلام بێبڕوایی با

ئازادیی و بەڕەڵڵایی با

زۆر لە مێژ بوو دەبا ئێستا

تاکە ڕێگەی یاسایی با

ئەگەر ئیسلام عەلمانیی با

دواکەوتوویی و نەزانیی با

دەبوو لە سایەی بێمێشکان

تاکە دینی جیهانیی با

گەر ئیسلام کێشەی بێحەل با

درۆیەکی تێر و تەسەل با

سیاسییەکان وایان دەکرد

بەرژەوەندیی گشیی گەل با!

گەر ئیسلام کۆیلەی کەوی با

بۆ زاڵمەکان نەوی با

لە سەرەتاوە دەیانهێشت

حاکمی هەموو زەوی با

ئەگەر ئیسلام نەخۆشیی با

گێلیی و مەستیی و بێهۆشیی با

وەها ڕیکلامیان بۆ دەکرد!

دکتۆری ساغ پەرۆشی با

گەر ئیسلام جەور و ستەم با

ڕێبەری ڕێی جەهەننەم با

دەبوو لە سایەی کافران

تاکە فیکری موحتەڕەم با!

قورئان و چەک

هەرکەس دەستێکی قورئان بێ
دەستێکی بــێ چـــەکی شان بێ
دەبێ یــان سجن ماڵی بێ
یان مــاڵی سجنی قورئان بێ

هەرکەس چەکێکی لە شان بێ
دەستیشی دوور لە قورئان بێ
بێ شک ئەو کـەسە زاڵمە
گـــەر مەلائیکەی ئاسمان بێ

هەرکەس دەستێکی قـورئان بــێ
چـەکێکیشی لە سەر شان بـــێ
هەر ئەو کـەسە لەسەر حـەقە
دوور لە ڕووتان بـا شەیتان بـــێ

شێرپەنجەی کوفر

بێباوەڕان نەخۆشێک بوون

خودا قورئانی بۆ ناردن

وەک شیفا بۆی هەڵبژاردن

ڕازیی نەبوون

دەردی پیسیان کەوتە هەڵچوون

بوو بە شێرپەنجەی کوشندە

بەسەر جەستەی مرۆڤایەتی

بوونە مەترسیی و دڕندە

بۆیە ئێمەی ساغ ناچارین

گەر زوو نەیانبڕینەوە

هەرهەموومان

دەردی ئەوان دەگرینەوە

غیابی حوکم

ئەو ژیانەی بەبێ حوکمی خودایە

بەس هەناسەی لەگەڵ مـردن جودایە

بڕوانە دووربینی مێژووی خیلافەت

سەری مسوڵمانان لووتکەی چیایە

ئێستاش لە سایەی عەلمانی سەرسەری

سەرمــــــان تۆپی کافرانە لەکایە

دەزانن بـــۆ دز و جەردە زۆر بووەە؟

چونکە سزای بڕینی دەست نەمایە

کوا بەیتولمالی زەکاتی هەژاران؟

بە شۆفەڵی دیموکراسی ڕووخایە!

بەناوی ئازادیی جوان بوو گەوادیی!!

ئازادێکی دوور لە خوا بەڕەڵڵایە

بۆ چارەی دەردی کوشندەی گەندەڵی

قورئان پیت بە پیتی حەبە شیفایە

سەد حاکمیش بگۆڕن نـــابنە بەشەر

هەتاوەکو حـوکمی بەشەر یاسایە

قوڕئان نەهات ئینسان ڕێگەی بۆ دانێ

بەڵـکو هەر خۆی بۆ مرۆڤ ڕێی هودایە

نەفرەت لە پەڕلەمان و دیموکراسی

بژی حوکمی خودا هەتا هەتایە

رەنجەڕۆیی

ڕەشکەی لە سوجدە نێوچەوان یەکخوداپەرست نەبیت
بستێک نوێژت ناچتە ئاسمان یەکخوداپەرست نـــەبیت
سەروەت و سامانی دونیا سەراپای موڵکـــــــــی تـــۆ بێ
خێرت پێدەشێ بە قوربان یەکـــــخوداپەرست نـــەبیت
گەر دکتۆرێ بــــــــــــی عیلاجی مردنیش بدۆزیـــــەوە!
تەوحیدت دەوێ بۆ دەرمان یەکخوداپەرست نــــــەبیت
کەسێکی هێندە دڵـخۆش بی بە خەویش خەم نەبینیت
خـــۆت خەمێکی لەناو خەمان یەکخوداپەرست نـەبیت
زانستی هـــــــەرهەموو گەوردن پیت بە پیتیت لەبەربێ
تەنـــــــــــــــیا نەزانێکی نەزان یەکخوداپەرست نەبیت
ئـــــــــــــەوەندە چاوکراوە بی وەک خۆر دونیا گەڕابیت
منداڵێکی لە نــــــــــــاو بێشکان یەکخوداپەرست نەبیت
لەسەر دینی سەد و بیست و چوار هەزار پێغەمبەر بیت
بێدینێکی وەکــــــــــــو شەیتان یەکخوداپەرست نەبیت

وەسیەتی شەهید

ئەبەو پەتەی کە دەیخەیە گەردنم

نامرێنی دەیمرێنی مردنم

گەرچی جەستەم لەبەردەمت کەوتووە

چی لە ڕۆحی شادم دەکەی دوژمنم

وا هەڵفڕیم بەرەو فیردەوسی بەرین

ئەگەر ئازای ڕایگرە ڕۆیشتنم

قاموسی دین دۆڕانی تـــێدا نییە

بەهەشتە شاهێدم بۆ سەرکەوتنم

دڵخۆش مەکە بە نەمانم لە دونیا

ئەوەی لەتۆ دڵی خۆشتر بێ منم

هەر دونیا نا لە دۆزەخیشت کردم

سوپاست دەکەم بۆ شەهید کردنم

دڵنیابە لەجێی من خۆت کووشتووە

پێشکەشت بـــێ دۆزەخی دوای کوشتنم

مەدخەلی

زۆر مونافیق و نەگبەتە مـــــــــەدخەلی

سوک و ڕیسوا و بێقیمەتە مەدخـــەلی

بشیکوژی ئیشی بە جـــــــیهاد نیـــــیە!

ترسنۆک و بێغیرەتە مـەدخـــــــــــەلی

مسوڵمانێکی تـــــــــــــــــازە و ناڕەسەنە

پێچەوانەی سەلەفیەتە مـــــــــەدخەلی

عیلمی غەیبی پـــێبێ چـــەکی پێنییە!

زەلیلی دەست عەلمانیەتە مـــــەدخەلی

مــــــــوجاهیدی لە کـــــــــن ئاژاوەگێڕە

لەلای وەلی ئەمرە چـــەتە مەدخـــەلی!!

لە دونیا دا هەموو شتێکی هـــــــەیـــە

فەقەد تەنیا بێ عیزەتە مـــــەدخەلی

هۆی خیلافە چـــونکە موتەخــــــــەلیفە

موخالیفی خیلافەتە مـــــــــــــەدخەلی!

حیزیی و سەلامەتیی!

ئەو خـــــــــەڵکە ئیسلامی ناوێ
بۆیـــــــــــــە جیهاد سەرناکەوێ
حـــــــــــــــەزیان لە بەڕەڵڵایە
حیـــــــــــزی و سەلامەتییانەوێ
خـــــــــــــەتای موجاهیدان نییە
نــــــــــــــایبەنەوە لێرە و لەوێ
ئـــــــــــــــەو ئیسلامە بە قیمەتە
بــــــــــۆ هیچ و پووچ هەڵناکەوێ
خوا مەجبوری هیچ کـــــەس نییە
بەس مەجبوری خۆی خۆشدەوێ
عـــــــــــــیزەت شایەنی سەرێکە
فەقـــــــــــــــەد بۆ خودا دانەوێ

سووسەیی

مامۆستامان

تۆ لەو زیندانە تاریکەی کوفرستنان دا

ڕووناکی بەر پەنجەرانی

بۆ جیهادی کەلیمەی حەق

وشەی تیژی وەکو نووکی خەنجەرانی

لەبەرامبەر پەردەی ڕەشی عەلمانیەت

شقارتەی سووتێنەرانی

لە مەیخانەی دیموکراسی

بۆ سەرخۆشان

سەتڵی پڕ ئاوی سەرانی

لە سەردەمی عەمامەی پێڵاوی تاغووت

ئەوە هەرتۆی نازهەڵگری مێزەرانی

مامۆستا گیان

تۆ لغاوی مورتەدد و کوفرکەرانی

تەوری مووس ئاسای شەڕەفی بڕینەوەی

قۆچی دەییوسی زاڵمی وەک بەرانی

هەربەخۆتی

داری دەستی حوکمی خوا سەپێنەرانی

دەستی سەری غەریبان و سەرخەرانی

مامۆستا گیان

تۆ نوقتە نوقتەی فێربوونی نووسینەوەی

تەوحیدی

هەر سەد و چل و چوار هەزار پێغەمبەرانی

هۆ مامۆستا سووسەیی گیان

تۆ لا چاوی حەقبینی مەی

لە تەنیشت چاوی شینهان

مامۆستا شێخ کامەرانی

موجاهید

تۆ تـــۆقێنەری تۆقینی مـوجاهیـــــــد

تۆ بـــــــــــەزێنەری بەزینی مـوجاهید

بوومەلەرزەی ڕاپەرینی ئـــومـمـەتـــی

بۆ عەرشی تاغووت لەرزینی موجاهید

لە ڕامالّینی پاشمـاوەی جـــــــەهــالەت

لافـــــاوی تەوژم و تینی مـــوجــــاهید

بــەرامبەر ڕەشەبای سووکی کـــافــران

چــیای قـــــایم و سەنگینی مـوجــاهید

بۆ ئەو مارانەی خـوار دەڕۆن بـــە ڕێدا

هەڵۆی تیژی چاو دووربینی مـوجاهید

ڕۆحی شیرینی جـەستەی ئـوممەتێکی

هەناسەی مانــــــەوەی ژینی مـوجاهید

قـــــیامەتی بۆ سەردەمی زەلـــــیلیی

سەردێـڕی مـێژووی زێڕینی مـوجاهید

خەتای خۆمانە

ئەگەر مرۆڤەکان راستگۆ بن
درۆ لەگەڵ خۆی درۆ دەکا
راستی بە زمانی دەدوێنێ

گەر مرۆڤەکان دلسۆز بن
خیانەت خیانەت لەخۆی دەکا
وەفا لەجێی خۆی دەڕوێنێ

ئەگەر مرۆڤەکان دەستپاک بن
دزی خۆی دەدزێتەوە
لە هیچ خۆی هەڵناقورتێنێ

ئەگەر مرۆڤەکان راست برۆن
خواریی خۆی خواردەکاتەوە
تا راستی بێتە سەرشانی
بۆ ئەبەد خۆی بناسێنێ

ئەگەر مرۆڤەکان دادگەر بن

زوڵم زوڵم لەخۆی دەکا

عەدالەت دادەمەزرێنێ

گەر مرۆڤەکان چاکەکاربن

تاوان تاوان لەخۆی دەکا

بەیەک فیشەک دەیتۆپێنی

لە ئیسلامە

چیمە و بۆچی دروستکرامە

کێ خالق و کێ خودامە

بۆ پرسیارم ئەو وەڵامە

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

سەربەرزیی و عیززەت و کەڕڕەم

ڕێز و ماف و فەخر و عەزەم

قەدر و بەهای بەنی ئادەم

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

ڕاستیی و مەنتق و هۆشیاریی

حەقکرداریی و یەک بڕیاریی

دادپەروەریی و دەوڵەتداریی

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

ژین بێ پاشا و گەدایەتیی

بێ کرمانجی و ئاغایەتی

لووتکەی بەرزی مرۆڤایەتی

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

بەس بۆ خودا بەرهەڵستیی

خۆشەویستیی و خۆنەویستیی

عیلاجی ڕەگەزپەرستیی

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

بڕواداریی و خوداناسیی

بەندایەتیی بە ئیخڵاسیی

چوونە بەهەشت بە پێخواسیی!!

هەر بەتەنها لە ئیسلامە

نامەلا

هەر مەلایەک پشـــــــتکا لە دادپـــەروەری

بۆ پشـــــــــــــتگیریی زاڵمان بێ مینبەری

مەلا نییە مونافیقە مـــــــــــــــونافیق

پێغەمـــــبەر لێـــــــــــی بێبەرییە بێبەری

مەلایەک غەیری حوکمی خوای قەبوڵ بێ

لە پێڵاوی نەویـــــــــــــــترە مـــــــێزەری

ئەو مەلایەی چـــــــەکی لەسەر شان نەبێ

شانی پڕ شەیتانن ئەوبەر ئـــــــــــــەوبەری

مەلای ئێستا بەس ورگ و قسەی گەورەن

پێچەوانەی عەمەل و مێـــــــــشکی سەری

پێغەمبەر فـــــــــــــــەرمانڕەوا بوو ئەزیزم

کوا لە ئاوقافێ دەیکرد فـــــــــەرمانبەری؟

جێنشینی ســـــــــــــــــەرکردە سەرکردەیە

نەک زەلیلی تاغووتێکی ســــــــــــــەرسەری

مەلای خائین نەک هەر میـــــــــــراتگر نییە

بە سەگ ناشێ بۆ دەرگای پێـــــــــغەمبەری.

شێخ کامەران

هـــــەر نـــاوت کـــامەران نەبوو

بـــەڵکو کامـــــــەرانییت پێبوو

هەر چاوت شین نـــەبوو،شینی

تەوحیدی ئـــــاسمانییت پێبوو

فەقەد بە ڕەحم و سۆز نەبووی

غیــــــــرەتی ڕەحمانییت پێبوو

بـــە هەویە مسوڵمان نـــەبووی

هـــــەویەی مسوڵمانییت پێبوو

تەنـــیا قوڕئانخوێنێ نـــەبووی

خـــوێنێکی قـــوڕئانییت پێبوو

عیلمـــەکەت دەردی دین نەبوو

دەرمـــــــانی عـەلمانییت پێبوو

زانایـــــــەکی نەزان نەبووی!!!!!

زانـــــینی نـــــــەزانییت پێبوو

ئیمـــــــانم پێتە شەهـــــــید بی

شەهـــــــادەی ئیمانییت پێبوو

بۆ مامۆستاکەم

لە زینـــــدانیش بـــــــــــترزێنن

پەیــــــامەکـــــەت نـــاوەستێنن

بنوو بێــــــــخەم مامۆستا گیان

وتـــــــارەکانت دەمـــــــــێـــــنن

خـــــۆ ئەگەر خوێنیشیان ڕشتی

خـــــــــــۆیان شەهیدیت بۆ دێنن

هەرچـــــــــی بکەن زەرەر دەکەن

لێشت گـــــــــــەڕێن هەر نامێنن

چونکە بەرەی مـــــــــوجاهیدان

هـــــــــــــەرگیز وازیان لێناهێنن

هــــــــەتا لەسەر لاشەی پیسیان

ئاڵای پـــــــاکیی نــــــــەچەقێنن

بەفەخرەوە ئەوشکەوتیین

بە فەخرەوە گشت پەروەردەی مـــــزگەوتیـن
لــــــــــــــە سەر فیکری بیابان و ئەشکەوتین
ئیسلام بــــــە شمشێر هاتبێ یـــــا تــــــەوقە
قەبــــــــــــــوڵمانە هەر یەکە حەق هەر حەقە
ئەگەر قــــــــــــورئان سەراپاشی بڕیـــــن بێ
وتـــــەی خـــــــوایە ڕازین بـــەرنامەی ژین بێ
دەڵێن عــــــــــــەرەبی پێخواسە پێــغــەمبەر!!
ڕاستە چـــونکە پێـــــــــڵاویان خستە سەر
مەرگی زیندان خۆشترە بــــــــــــە خواناسی
لــــــــە ژیانی بـــــــــــــەڕەڵڵای دیموکراسی
دینێک کە بەرنامەی خــــــــــــالقی گشت بێ
وەری دەگرین پشکۆی ئاگـــــــــری مشت بێ
با کــــــــــــــــافریش هەروەکو سەگ بحەپێ
بەری خـــــۆرێ نــــــــــــــــاگیرێ بە ناولەپێ

مەدحی ڕەسوڵ

ڕۆمان پیتە لە وەسفت ئەی مــوحەممەد

نووقـتەی ئەخیر پێشەکییە سەد لە سەد

خۆشەویستی ڕقـــــــە لە ڕاست ئەوینت

ئیمان کوفرە دەرحەق بە حــــەقی دینت

چیا دۆڵە لە ئاست بـــــــــەرزی سەری تۆ

کیتاب چەکە لە مــــەڕ عیـــلمی بەری تۆ

مانـــــگ برینە بـــــــەرامبەری جــــوانیت

کانی چـــــــــڵکاوە لە ڕاستیی و ڕەوانیت

سەعات بـــــــــەردە بەراورد بە هیلاکیت

خـــــێر فیتنەیە لە مقـــــاڕەنەی چاکیت

خۆر پەردەیە ئـــــەمامی مەشخەڵی ڕێت

داک پیرییە لە چـــاو خـــــاڵیبوونی جێت

تەوحید

دەژین دەمرین فەقەد بۆ مانی تــەوحید

هەمانـــــە نیهانە سامـــــــــانی تــەوحید

خەندەی مولحید گریانی لێـــــــــدەبارێ

دڵخۆشین بە خەم و گریانی تەوحیـــد

دەرد و نەخۆشییە بـــــــــــرینی بێدین

بۆمان دەرمانـــــە ئێش و ژانی تەوحید

ئەسیری شەیـــــــــــتانن کافری بەڕەڵڵا

ئازادییە بۆمـــــــــــان زیندانی تەوحید

سەری شۆڕە پەنجەی شیرکی ئینتیخاب

بەرزە پەنجەی شایەدوومانی تەوحـــید

تاکە ئەمـنە لە ڕۆژی خـــــــێر و شەڕدا

بۆیە شەڕمـــــانە بۆ ئەمــــانی تــەوحید

ئیسلام گشتە

ئیسلام هەر تەنیا دین نییە
سیستەمیشە
نەوەک هەر بۆ ئەوسا و ئێستا
بۆ هەمیشە

ئیسلام هەر دار سیواک نییە
لە خزمەتی کۆمەڵگەشە
بۆ پاکڕەویی
کوتک و خوترمە و جەڵدەشە

ئیسلام تەنیا سەلام نییە
لە ناچاریی عینادیشە
شەڕ و جەنگ و جیهادیشە

ئیسلام هەر ترسی خوا نییە
غیرەتیشە

تەنیا سوجدە و ڕکوع نییە

سەربەرزییە عیززەتیشە

ئیسلام قەبر و قیامەت نییە

ژیانیشە

هەر بەینی عەبد و خوا نییە

دەستووری پەڕلەمانیشە

ئیسلام تەنیا مەلا نییە

سەرۆکیشە

قوماشی سەر (چاک)ان نییە

بەڵکو ئاڵا و پەڕۆکیشە

ئیسلام هەر مەحکەمە نییە

حوکمەتیشە

ئیسلام هەر مزگەوت نییە

دەوڵەتیشە

# ئیعلامی کوفر

هـــــــــەزار لەعنەت لە ئیعلامی کوفر بێ
ڕەببی دۆزەخ سەرەنـــــجامی کـــوفر بێ
کەڕ و کـــوێرن لە ئاست خوێنی مسوڵمان
ئیــــــــــــلاهی لاڵبوون کەلامی کوفر بێ
خوێ دەکەنە برینی کۆن و نوێی ئیسلام
دەک سەرەتان سەبەب زامـــــی کـوفر بێ
درۆ و بوختان دەبەستن بــــــــۆ ئیماندار
خــــــــــوایە ڕووڕەشیی ئاکامی کوفر بێ
هـەرکـــــەس گاڵتە بە شیعاری دین دەکا
کـــــــــەمئەندام بێ کە ئەندامی کوفر بێ
تـــــف لە مایک و لە هەیکەل و شاشەتان
داری مێزتان بـــــــــــە ئیعدامی کوفر بێ

مەحاڵ

هەرکـــــــات ئـــاگر پێیکرا ئاو بسووتێنێ

ئەودەمەی بـــــــــەفر توانی خۆر بتوێنێ

گەر زەوی بۆی گونجا ئاسمان بڕوخێنی

ئـــــەوساکەینێ کوفر ئیسلام لەبن دێنێ

عوزری باتڵ

هەرکەس کافری بە چـــاوی سەر دیبێ

کەچـی چاوەڕێی موحەممەد مهدی بێ

یان نابیـــنایە یانیش بێـــــــــــــبڕوایە

جیهاد نامرێ تا یەک کافر زنـــــــدی بێ

گەوواد!

سەرۆکێک پشت لە کافر نەکا دەییوسە

تف لە یاسای پەڕلەمان نەکا دەییوسە

قورئان نامووس و شەڕەفی مســـــولمانە

حاکم حوکم بە قورئان نەکا دەییوسە

هەر سەرکردەیەک میلـلەتی بەڕەڵڵا کـــــا

بەشەرعی خوا چارەیان نەکا دەییوسە

گەل ڕۆڵەیە ، ڕەئیس باوکە ،دین ڕەوشتە

باب ئەخلاقی ڕۆڵەی جوان نەکا دەییوسە

شەهیدی ڕاستەقینە

مـن شەهیدی ڕاستەقینەم
چونکە کوژراوی ئەو دینەم
بە غەیری بەرنامەی خودا
هیچی تێدا نەبوو سینەم
لەڕێی خاک و کوفر و کافر
خۆم نەفەوتاند ئەلەو ژینەم
شادی بکەن شەکراو بخۆن
وازبێنن لەو گریە و شینەم
ئاهەنگم تێکمەدەن، لەگەڵ
ئەو هەمووە حورلعینەم
دونیای تەسکم جێهشتووە
وا لەو فیردەوسە بەرینەم

نیقابپۆش

هــــــــەر ئافرەتێ کە نیقاب و حـــەبایە

سەری هـــەڵۆی لووتـــکەی بەرزی چیایە

بــــــــە ملیۆنان سفور ناگەن بە پەنجەی

هـــــــــــەزار پیاوی سمێڵ پانی فیدایە

وا مـــــــــــــەزانن دایکــــی منداڵانە هەر

دایکی نـــاموس و ئـــەخلاق و حەیایە

چــــی لە شاجوانی دونیای ناشرین کەم

مــــــــــونەقەبە مـــەلیکەی دوو دونیایە

کەسێ حـــۆری شاگردی بێ لە بەهەشت

دەبێ بەخۆی چەندە جوان بێ خودایە!

توونڕەوم

بەڵێ لە سەدا سەد وایە توونڕەوم

بـەو خودایە بۆ خودایە توونڕەوم

دۆستی هەموو دۆستێکی دۆستم خودام

دژی ئەوەی دژی خوایە توونڕەوم

لەگەڵ ئیماندااران نەرمم وەکو ئاو

دەنا وەک چـــی ڕەشایە توونڕەوم

توندم چونکە ئێستاکە حەق تاوانە

بۆ ئەو باتڵەی یاسایە توونڕەوم

تا ئەوڕۆژەی هەموو دونیا شل نەبن

بۆ ئەو دینەی کە کۆتایە توونڕەوم

ئێستە زانیتان بۆ ئاوا توندڕەوم؟

چیتر مەڵێن هەر ئاوایە توونڕەوم.

کوردی بێ ئیسلام!

کورد بەبێ ئیسلام گەلێکی فاشل و دواکـەوتووە

دینی نەبێ کەس نایناسێ دووسەد و پەنجا ڕووە

باشبوو قورئان هات ڕەفتاری گشت عالەمی کردە یەک

گەرنا لەوەتەی هەیە چاوی لە خــەڵکی کردووە

گەر ئیسلام مسـوڵمانانی نەکردابایە برا

کورد نەدەما لەبەرئەوەی هەر بەگژیەک داچووە

خودا پێغەمبەری نارد کوردی لەبەشـەر کڕییەوە

چونکە قەومێکی تابڵێی خائین و خـۆفرۆش بووە

ئاینی ئیسلام نەبا کەس نەیدەزانی کـورد چییە

کێ وەک سەڵاحەددین کوردی بە دونـیا ناساندووە

کوفر و ئیمان

کوفر و ئیمان زۆر نزیکن

مەودایان هەر یەک پەنجەیە

جارێ بۆ مۆری ئینتیخاب

جارێکیش بۆ شەهادەیە

بۆ بە حیزبت دەیکەیتە دوو

ئیسلام یەکە تاکو هەیە

موحەممەدت سەرکردە بێ

سەرکردەی تر زیادەیە

دەستووری ترت بۆ چییە؟

قورئان یاسای هەمیشەیە

دین ئاوایە گەر دەتەوێ

کە ناتەوێ تێکی مەیە

ئیسلام واتە حوکمی ئیسلام

بێ حوکم ئیسلام کامەیە؟

خودا یەکە نابێ بە دوو

ڕێگەی خوداش یەک ڕێگەیە

دەنگ نادەم

من ناچم بۆ هەڵبژاردن

دەنگی خوام هەڵبژاردووە

ناچمە پاڵی هیچ لایەنێ

ئیسلام یەکە کوانێ دووە؟!

دەنگ نادەمە هیچ کاندیدێ

خوا پێغەمبەری ناردووە

بۆ هیچ دەستووری مۆر ناکەم

قورئان نامرێ زیندووە

نەخێر بۆ ئەو حکومەتەی

بەشەر دروستیکردووە

بەڵێ بۆ حوکمی ئەو خوای

دروستکەری هەرهەمووە

هەرکەسێ وەکو من نەکا

سوێند بە خودا کافر بووە

## تەعزییە جەژن

ئەو جەژنە جەژنی تۆ نییە
هەر بۆ لەززەت تێبکۆشی
لەجێگەی شیرینی ئیمان
چکلێت و شەربەت بنۆشی
لە بری لیباسی تەقوا
بەرگی مۆدێرن بپۆشی
تەوقە نەکەی لەگەڵ خێردا
ماچ بکەی ڕووی شەڕ بە جۆشی
لەجێی چوونە ماڵی تەوبە
بۆ دەرگای تاوان پەرۆشی
ئەو جەژنە تەعزیەی تۆیە
گەر تێبفکری بهۆشی
باش بژی تاکو باش بمریت
مەژی و مەمرە هەر بۆ خۆشی

فیدایی

ئیسلامەکەم بۆت دەســـووتێم

چۆن خۆر بۆ زەوی دەسووتێ

ئارەقەت بۆ هەڵـــــــــــــدەڕێژم

وەک بــــــاران کە دایدەکووتێ

چـۆن زەوی چیای هەڵگرتووە

ئـــــــــــاوا بارت دەخەمە شان

بـــــــــەوێنەی تیری ناو کەوان

دوژمنت دەکـــــــــــەمە نیشان

ناحـــــــــــــەزانت ڕادەمــــــاڵم

چـــــەشنی لافاوی بێ ویژدان

دەبم بە گــــــــڕکان بۆت تاکو

کـــــــــــــافر بسووتێ لە تاوت

هەروەکو میلی کـــــــــاتژمێر

قەت نـــــــــاوەستم لە پێناوت

دڵـــــــــــــــم کانی بێ پەڵەیە

دەمـــــــــــــــاریشم جۆگەڵەیە

بەخـــوێنی خۆم دەدەم ئاوی

داری ئـــــــــــاڵاکەت تا ماوی

دین و کۆمەڵ

ئەی بێـدینان دڵنیابن چرکەیەک
دین و کۆمەڵ قەت جودا نابن لەیەک
مادام خودا خودای گشت کۆمەڵگەیە
دینی خوداش بۆ هەمووانە یەک بە یەک
ئەگەر دیموکراسی هی خودا بایە
نەتاندەدا هەمووان بەهـیچ شێوەیەک
دین بۆ تاکە بەس تاک تاکەی هەموو تاک
دیموکراسیش هیچــە بۆ هیج بەندەیەک
گەر هەر تاکە و پێغەمبەرێکی هەبا
ئەوسا ئاین بۆ تاک دەیبوو بەڵگەیەک
بەڵام پێغەمبەرێک بۆ قەومێک بووە
یانی تاقە دینێک بۆ کۆمەڵگەیەک
ئاین مانگە هەر تاکێک ئەسـتێرەیە
هیچ ناگۆڕێ بە حەپینی هـیج سەیەک
(ئاین بۆ تاک دیموکراسیش بۆ هەمووان)
لەوە حیزتر نەبووە و نابێ ڕستـەیەک

عەلمانی

مسوڵمانی ئەمریکییە عەلمانی

عادییە کوا سعـودییە عەلمانی

ئایینەکەی سەر تەسکەرەی تەزویرە

لـە سەر دینی بێدینییە عەلمانی

بە گوفتار دیندارە کرداریش بێدین

موونافیقێکی ئەسڵییە عەلمـانی

بەندەیەکی زۆر موخڵیسی شەیـتانە

هیچ کارێکی بە خوا نییە عەلمانی

لە ژێر فەرمانی پێغەمبەر تاغووتە

دینەکەی دیـموکراسییە عەلمانی

قانوونی پەڕلەمانە قورئانەکەی

ئەگەر کافر نەبێ چییە عەلمانی؟

ڕیشەکەم

ڕیشەکەم ئەی ئەو مووانەی

دانە دانەت وەکو تیرن

لەناو دڵـی بێدینانەدا

تـیژ و کاریگەر و گیرن

هۆ تۆڕەکەی ڕاوی ئیمان

نەفس و شەیتان لێت ئەسیرن

سوپای پاڵپشتی غیرەتم

تاڵ تاڵت جوندی پشتگیرن

موو بە مووت داوی چنراون

پەردەی ئابڕووی گەنج و پیرن

ڕەگـی داری سەری بەرزم

دەمارم بۆت بۆڕی بیرن

خەونی حوشتر

ئــــــــەوەی بڵێ دیموکراسی

حــوکمی شەرعی بەدیدێنێ

هــــــەم بەخۆی خەڵەتێنراوە

هـەم خەڵکیش دەخەڵەتێنێ

چــــاوەڕێی دەستی کەچەڵە

تاڵ تاڵ مووی پرچی بڕوێنێ

بەتەمای قــــاچی پێخواسە

جـــــــووتێ پێڵاوی بۆ بێنێ

چـاوی لە کــــــوێری بێچاوە

ڕووناکــــــی بۆ دابگیرسێنێ

ئینــــــــــتیزاری بیــــــابانە

ئــــــاوی داتێ و نەیخنکێنێ

دیموکراسی دایکـــی کوفرە

ئیمان هــــــــەرگیز نالاوێنێ

جــــــارجارە بەناوی ئیسلام

کۆرپەلەی زۆڵ بەرهەمدێنێ

مسۆڵمانی ڕەسەن هـــەرگیز

ڕووی ناداتێ و نــــــایدوێنێ

باڵایی

گشت دونیام پێدەن نامەوێ

حوکمی خوام بۆ دونیام دەوێ

بـاوەڕ بـە بێبڕوا ناکەم

هەر دینم بۆ بڕوام دەوێ

یاسا بۆ قورئان دانانێم

قـورئانم بۆ یاسام دەوێ

پێشیشم بگرن ئـەحمەدم

وەک تــاکە پێشەوام دەوێ

پاسپۆرتی گشت زەویم دەنێ

یەک دەوڵـەت و ئاڵام دەوێ

عومری خدریشم بدەنێ

شەهیدبوونی غـەزام دەوێ

لـە قیامەتیش دەڵێم خوایە

من فیردەوسی ئەعلام دەوێ

شوکرانە

گەر ئیـــــــسلام دوور لێرانە با

دەبـــوایە حـەق بێگـــــانە با

مـــــرۆڤایەتی هــەر بەڕاستی

درۆی ئەو مــــــانگی نیسانە با

ڕەوشـــــت وەکو ئـــــاوارەیەک

دەربــــەدەر و بێــــــلانــــــە با

هۆشیاریی زۆر بەبێهۆشــــیی

لە ســــوچێکی مـەیــــخانە با

پەیـــــــوەندیی کــۆمەڵایــەتی

بەو شـــــــــاخانە دێــــوانە با

لە سایـــەی گۆشتی بــــەرازی

غیرەت چەشنی ئەفســــانە با

بە کورتیی ژین دوور لە خودا

ڕیـــــــــسوایی و نامەردانە با

دۆزەخ وەکـــو ڕۆژی ڕوون و

بەهەشت خـەونی شەوانە با!

شەهید نابێ

هەرکەس تۆپی وەک سەگی هار شەهید نابێ

خۆفرۆشێک بۆ دوو دینار شـــــــــــەهید نابێ

شەهید ئەو کەسەیە زاڵمێک دەیـــــــــــــکوژێ

کوژراوێک بۆ کورسی زۆردار شــــەهید نابێ

خاکێک ئەگەر دەستورەکەی قورئان نــــــەبێ

زیندوو گەر بۆی بمرێ سەدجار شـەهید نابێ

پلەی مسوڵمانی چاک و پاکە شــــــــــــــەهید

غەیرەدینی پیس و لاسار شــــــــــەهید نابێ

خودا هەرخۆی بڕیار دەدا کــــــــــێ شەهیدە

کەس بە قسەی مرۆڤی بەدکار شـەهید نابێ

خەشیمنامە

هــــــــەرکەسێک چاوی لە پەڕلەمان بێ

کە بۆی سەرچاوەی حوکمی قورئان بێ

کــــــــــەر لە ئاستیدا خاوەن مەزهەبە

بــــــا هەر گوێدرێژ بێ لەژێر کورتان بێ

پــــــــــــــەڕلەمانێک بێ ئەقڵ وەلانێ

حــــــوکمی خودایی لەسەر دەنگدان بێ

بڵـــــــــــــــــــێ زۆرینە دەکەمە حاکم

جــــــا بـــــەرەی کوفر یانیش ئیمان بێ

پـــــــەڕلەمان عەبدی زۆرینەی خەڵکە!

خــــــوداشی ناوێ دەنگی نوقسان بێ!

خــــــــوایەتیی خودا دەنگی بۆ چییە؟

کـــــــە بەبێدەنگیش خودای جیهان بێ

خـــــــــــــــــودا چ باکی بە زۆرینەیە؟

کە هەرخۆی تەنیا پاشای هــەمووان بێ

جــــــا حوکمی خودا یاسای بۆ چییە! ؟

هـــــــــــــــەموو یاساکان بۆ زبڵدان بێ

سوێندی سەرۆکایەتیی

وەرن میللەتــی گەمژە

بــا خۆڵ بە چاوتان داکەم

من دوژمنێکی پیسی

ئا ئەم قورئانە پاکەم

خوا دەڵێ حوکمی پێکە

ئـەی چی لە ئەمریکا کەم ؟!

منیان کـردۆتە سەرۆک

تا دوژمنێتی خوا کەم

بۆیە من ناچار دەبم

ئێستــاکە خۆم یەکلا کەم

تاکو کورسیم لەق نەبێ

حـوکمـی کوفر بەرپاکەم

سوێند دەخۆم بەم قورئانە

حوکم بە قـورئـان ناکـەم!

وەکو من بان

گەر هەمووتان وەکو مـــــن بان
کوفر و زەوی جودا دەبـــــوو
حوکم حوکمی خودا دەبـــوو

گەر هەمووتان وەکو من بان
دادوەریی ڕیسوا نەدەبـــوو
گەندەڵیی ئەفسانە دەبـــــوو

گەر هەمووتان وەکو من بـان
ئیسلام ڕێسای ژیان دەبـوو
تاکە دەستوور قوڕئان دەبـوو

گەر هەمووتان وەکو من بـان
بەشی زاڵم هەر شەق دەبـوو
ناحەق قوربانی حەق دەبـوو

گەر هەمووتان وەکو من بان

لەپێناوی پارۆیک قـووت

کەس نەدەبووە کۆیلەی تاغـووت

گەر هەمووتان وەکو مـن بان

دیموکراسی درۆ دەبـوو

حوکمی بەشەر نامۆ دەبـوو

گەر هەمووتان وەکو مـن بان

دونیاویستیی عەیب دەبـوو

بێباوەڕیی غەیب دەبـــوو

گەر هەمووتان وەکو مـــــن بـــان

زەوی هەر سوپایەک دەبـــــــــوو

یەک خاک و ئاڵایەک دەبـــــــــوو

گەر هەمووتان وەکـــــــو من بان

گشت هاودین دەبووین وەک برا

کەس وەک کافر نـــــــــەدەکوژرا

گەر هەمووتان وەکو مـــــــــن بان

سەرکردە بەس الله دەبـــــــــــوو

هاوبەشی خوا هەر خوا دەبـــوو

مولحید

تۆ کە مولحیدی بزانە کەر لەتۆ زاناترە

ڕاستە گوێدرێژە بەڵام زۆر گوێگر و داناترە

بە گژ خودایەک دادەچی کە خۆی دروستیکردووی

پشیلە بۆ خاوەنی خۆی لەتۆ بەوەفاتــرە

تۆ کە ناتوانی بە نەفسی خۆت بوێری بێغیرەت

ڕێوی هەرچەند حیزبێ لەتۆ ڕەشید و ئازاتــرە

لە هەوا بەڕەڵڵاتری و باسی سەربەرزیی دەکەی

بەراز لێت بەشەڕەفتر و بەشەرم و حەیا ترە

دەمت داخە باسی ڕۆشنبیریی و هۆشیاریی مەکە

سەرخۆشێکی سەرشەقامان لەتۆ بە ئاگا تــرە

نیشتیمانم قورئانە

هەر جێگەیەک دەستوورەکەی قورئان بێ

فەرقی نییە هی کام قەوم و زمان بـــــێ

بەس ئەو جێیە خاک و وڵاتی منـــــــــــە

گەر وانەبێ نەعلەت لە کوردستان بـــــێ

تووڕەیی پیرۆز

برســـــــی زویر بـــێ لەتێک نانی دەوێ

نەخۆش گەر عاجز بێ دەرمانی دەوێ

بـــــەڵام ئـــەوەی لە پێناو خوا تووڕە بێ

تەنیا و تەنیا حوکمی قـــورئانـــی دەوێ

فیکری جێگیر

دوژمن بشفڕی ئاسمان ئەسیرکەی

عەردیش لەژێرپێت کۆت و زنجیرکەی

تەنیا پێتدەکرێ جەستەم دەسگیرکەی

هەرگیز ناتوانی فیکرم داگیرکەی

قەینا

هۆ کافران قەینا حوکمی دونیا کەن

شۆڕشێکی دیموکراسیی بەرپا کەن

بڕۆن زەوی لە دەست خودا دەربێنن

ئینجا دین و دەوڵەت لەیەک جودا کەن

کیشوەری دیموکرات

زەوی چەشنی باخچەی حەیوانە لێرە

بەخودای قـــــەیرانی ئینسانە لێرە

سەیرە خـەڵک مردن بە پارە ناکڕن

ئەوەی هـیچ بەهای نەبێ ژیانە لێرە

کۆت و زنجیر بۆ دەست و پێی مەردانە

ڕزگاریی هـەر بۆ کۆیلەکانە لێرە

حەپس جێـگەی کەسی حەقدۆست و پاکە

کافر و جـەردە پاسەوانە لێرە

ئازادیی تەسکترە لە کونــــی مار

فراوانترین جــــێگە زیندانە لێرە

خەڵکـــی وڵاتان بۆ یەکڕیزیی دەمرن

تەبایی جێـــــگەی گۆڕستانە لێرە

سەری خـــۆمانە تۆپی بەر شووتانە

تاجـــی سەرە کەوشی بێگانە لێرە

عالـەم وا پێشبڕکێی داهێنان دەکەن

عەجــەب مونافەسەی قەیرانە لێرە

لە گشت دونیا لە پاش گریان خەندەیە

کەچـی گریان لە دوای گریانە لێرە

هەمـوو جوانێک لێرانە ناشرینە

ئەوەی کــە ناشرین بێت جوانە لێرە

نەوت نەبا هەر دەمردین لە برسان

خـوا سەرکاری ئاشی نەزانە لێرە

دەستی مـاندوو لەسەر زگی برسییە

کورسی بۆ ورگ و مــــلی پانە لێرە

کەسی دانا وەکــو پوڵی چرووکە

باو باوی نـــەفام و نادانە لێرە

کـەر ئاقڵە ناوکی لە چۆک نزیکە

ئەقڵـی بەشەر لەناو گیرفانە لێرە

لەبــەر خرینگەی فلووس و دیناران

کێ گـــوێی لە هاواری ویژدانە لێرە

ئەقڵ لێرە نەخۆشییە نەخۆشیی

ئای کە خۆ گێلکردن دەرمـانە لێرە

شادیی و دەماغ وەک شەو و ڕۆژ لێک دوورن

هۆشیاریی موگناتـیسی ژانە لێرە

ئەو میلـلەتە هەرخۆی ســەرحۆش و گێژە

پێویست ناکا هەبێ مەیـخانە لێرە

گەوجەکان خەریکی چــاکەکردنن

خــراپە ئیشی ڕۆشنبیرانە لێـرە

چۆن سەری خۆم لەخەفەتان با نەدەم

هونـەر ئێستا بەس قون بادانە لێرە

بەس ڕەمەزانان ڕۆژووان دەشــکێنین

مانگەکانی تر دڵــــشکانـە لێـــــــــرە

سێبەری خۆشت لەگەڵت ڕاست نییە

ڕاستترین شت دەسکی گــــۆچانە لێرە

گومان دەبـەم ئەو دۆزەخە زەوی بێ

کەمـترین شت دین و ئیمانە لێرە

یەک بێئـــــــەمریی خوای کرد ئێمەش هەزاران

بێتـاوانترین کەس شەیتانە لێرە

حیزب دینە سەرۆک حیزبیش خــودایە!!!!

دەستووری پەڕلەمان قــوڕئانە لێرە

میراتگرانی پێـغەمبەر جەردەنە

دوژمـنانی ئاین مـەلانە لێرە

کوردستانیان کـردۆتە مەسئولستان

کــورد ئاوارە و لە هەندەرانە لێرە

نەکەس لـێم تێدەگا نە لەکەس دەگەم

گـەرچی هەموو کەس هاوزمانە لێرە

چەواشەی ئیعلام

ئاگاداربن مسوڵمانان

ئێستاکانە دژی  ئیسلام

لە چەواشەکاریی ئیعلام

زۆر ئازادیی

بە واتای بەڕەڵڵایی دێت

گەلێ جیاوازیی بیروڕا

بە مانای بێبڕوایی دێت

ئەمنییەتیش بۆ ئەمینان

بە مەعنای شەڕ و ئەشکەنجە و

زیندانی تاهەتایی دێت

گەلێ شتی وەک 'کرانەوە!

لە شوێنی بێ حەیایی دێت

مسوڵمانی میانڕەویش!

بۆ حیزی و نائازایی دێت

زۆرێک دەستەواژەی وەکو

فرە ئایینی

بۆ بێدینیی و گۆمڕایی دێت

گەلێک دروشمی بە وێنەی

پێکەوەژیان

بە مەخسەدی شۆڤینیی و ناتەبایی دێت

زۆر کەلیمەی بە شێوەی دەسەڵاتی گەل

بە مەبەستی

ژێردەستەیی و ڕیسوایی دێت

زۆر شتی وەک مافی مرۆڤ

بۆ مەرامی پیسی حەیوانگەرایی دێت

چەندین وشەی

نمونەی (جەنابی سەرۆک)

بە مەعنای بێ خودایی دێت

زۆرێک لە دەزگای زانیاری

لەجێگەی بێئاگایی دێت

پاراستنیش بۆ مەبەستی پەرستنی

کوفری پیسی دنیایی دێت

زۆر،ئاسایش

لە بری تێکدانی ڕەوشی ئاسایی دێت

چاک بزانن

وشەی تیرۆر

لە جێگەی ئیسلامی پڕ ئاشتەوایی دێت

تیرۆرستیش

بۆ یەک خوداپەرستێکی فیدایی دێت

کەلیمەی دژە تیرۆریش

بە مانای دۆستی کافر و

دژی حوکمی ئەڵڵایی دێت

دڵنیا بن ڕۆژێک هەر دێ

بە تەکبیری موجاهیدان

درۆ و دەلەسەی کافران کۆتایی دێت.

حەیف

خودا ئاژەڵی دروستکرد

بەبێ ئەقڵ زەمانی زوو

ئەمری پێکرد بێ ئەقڵ بێ

بە ئاقڵی بێ ئەقڵ بوو!!!

گەرچی بەهەشتی لە دەستچوو!!

لە ئەمری خاڵق دەرنەچوو!!

ئەوجارە بەشەری خوڵقاند

ئەقڵی لەناو کـەلـلەی چەقاند

پێی گوت ئاقڵ بە ئەی ئینسان

وا بۆتم دابەزاند قوڕئان

نەیکەی بە دەستووری ژینت

دەتخەمە ناو دۆزەخ ئامان

کەچی بەشەر بە بێ ئەقڵی

حوکم دەکا بە پەڕلەمان

بۆیە گەر بە پاکی نەژی

مرۆڤ پیسترین بوونەوەرە

هەرچـــــــی ناوی گیانلەبەرە

لەپاش مـــــــردن ســـزا نادرێ

جەهەننەم بەس بۆ بەشەرە

عبدالطاغوت

ئەتۆ عـــەبدولـلەتیف نیت

بـــەڵكو عەبدی تـــاغووتی

حاشا گـەر سەلەفیش بیت

کـەرخەلی زەڕە و جـووتی

خـــۆت لا کۆتری ئاشتییە

قـــــەڵەڕەشی پەڕپووتی

سەڕەتــــــانی ئوممەتی

بـــــۆ کافرانیش قووتی

بێشکەی شیرک و نـــیفاقی

لـــــەڕووی ئیمان تـابووتی

لەگەڵ ئیسلام لێک doorن

هەروەک پلایس و شووتی

وەلـــی ئەمر دەییوس بێ

وەک حیز لەگـەڵی جووتی

کورد و ئیسلام

وەک چۆن ماسی ناژی بێ ئاو

هەروەکو پەپوولە و بەهار

مۆم و ئاگر

سپێدە و گزنگی هەتاو

بینیوتانە شەو بەبێ مانگ؟!

ستێر بێ باوەشی ئاسمان

چاوی مرۆڤ بەبێ برژانگ

چۆن دەتوانێ

بەفر بەبێ سەرما و سۆڵە

تینوو بێ فڕ ، دڵ بێ ترپە

گەردوون بێ خوا

زریان بێ شەپۆڵی تۆڵە

گەر بینیتان ساڵێک پاییز هات و ڕۆیی

بێ ڕەشەبای تووش و بەسام

ئەوسا بڵێن دەشێ بژی کورد بێ ئیسلام

تاکەی بێهۆشی

بەنی ئادەم هەتاکو کەی بێهۆشی

ئەقڵت بەگەڕ خە مەگەر کەلـلە بۆشی

ژیانی دونیا تاقیکردنەوەی تۆیە

نەهاتوویە ئێرە بۆ کەیف و خۆشی

خوا ڕازیکە تا بتباتە جەننەتی

ئەگەر بۆ ژیانێکی خۆش پەرۆشی

بەهەشت دەوردراوە بە تێکۆشان

دەستی لێ بشۆ گەر سست و خامۆشی

ئەلێرانە پشت لە ناڕەحەتی کەی

دۆزەخ لەولای حازرە دەچیە کۆشی

تا هەی ماندووبە نەمای ئیسرەحاتی

بمری هیلاکی لە ژین تێنەکۆشی

خۆ نەچەمێنن!

خـــــۆ نەچەمێنن خۆنەچەمێنن

لــــــــەبەر کامێرا خۆتان بنوێنن

کــــــــامێرا ڕۆیی ڕاکەن نەمێنن

تـــــــــەلەفۆن بکەن تەیارە بێنن

دەنــــــا موجاهید دەمان تۆپێنن

تەختی تاغووتمان لێدەڕووخێنن

خیـــلافەت لەجێی دادەمەزرێنن

خــــۆنەچەمێنن گەر تەیارە هات

ئەگەریش نەهات خۆ بقووچێنن

بانگی موناسڕێک

هـــــــۆ دەوڵەتی کوفر بەزێن
ئەی حوکمی خودایی سەپێن
یـــــەکخواپەرستان چاوەڕێن
دەدەرکەون ئێستا لــــە کوێن

هـــــــەموو بۆتان موناسڕین
فرمێسک و خوێنمان ناسڕین
تـــــا بەرگی خەفەت دادڕین
دەدەرکەون ئێستا لــــە کوێن

دەوەرنەوە تـــــــــاکەی ونن
مـــــایەی خۆشحاڵیی دوژمنن
سەرخـەر ژێردەست و سجنن
دەدەرکەون ئێستا لــــە کوێن

سەرکەوتن بەس لەخواوە دێ

دۆڕان پـــــــەندی لەدواوە دێ

وەرن فـــــــەتحی نەبڕاوە دێ

دەوەرنەوە تخوا لـــــە کوێن ؟

دروستکەرین نەک دروستکراو

ئـــــــێمە دروستکراوی خوداین

بـــــە ئەمری خواش نێردراوین

بـــــــــۆ لەناوبردنی ئەمریکا و

هــــــــــــاوپەیمانانی خوڵقاوین

هـــەر جەیشێ دوژمنی خوا بێ

لــــــــــــە بەرامبەری جەنگاوین

هـیچ هێزێکمان لـــە پشت نییە

بـــە تـــاقی تـــەنیا وەستاوین

هـــــــــــەموو دونیا لە دژمانن

لــــــــە گشت لایێ دەوردراوین

نـــــــــــــە گاور چەکمان پێدەدا

نـــە جوولـــەکە مەشقی داوین

نـــــــــــــــــــە تەیارە لەگەڵمانە

نــــــــە لای کافر ڕاسپێردراوین

ئێوەن دروستکراوی کـــــــوفرن

مـــــــــــــــونافیق و گوماناوین

نـــــــــــاوی خۆتان لێمان مەنێن

ئــــــــــــــێمە خوا ناوی لێناوین

مـــــــوجاهیدی دەولەی ئیسلام

لــــــــــــــە قورئان وا ناوبراوین

ئـــــــەوە ئێمەین دروستکەریی

ئــــــــــــەو خیلافەتەی لە ناوین

ئـــێوەش بۆ ڕووخان نێردراون

ئێستا کـــامان دروستکراوین؟

ئێــــــــــــوە هەر ڕۆبۆتی کوفرن

ئێـــمەش هەر موجاهید ناوین

هــــــــەر ڕۆژە و بوختانێ بکەن

هــــــەر یەک ناوین تاکو ماوین

پێڕستی هۆنراوەکان

دیوانی

گەڕانەوەی خیلافەت

شاعیر

دەولەیی

بەرواری نوسینەوەی

٢٠١٤ تا ٢٠١٩

ئامادەکردنی

پێگەی نهاوند

